# پلەو پایەی

# چاککردنی نێوان موسڵمانان

# لە ئیسلامدا

نووسینی : شێخ ربیع کوری هادی المدخلی خوای گەورە بیپارێزێ

وەرگێرانی : ڕێگای پێشین



بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار ، صەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ، وە لەسەر ئال بەیت و هاوەڵانی وئەوانەی شوێنیان دەکەون :

بێگومان چاککردن (صلح) لە نێوان موسڵمان دا لە گەورەترین مەبەستەکانە کە ئیسلام پێی هاتووە بۆ بە جێگەیاندنی ، وە خوای گەورە فەرمانی کردوە لە کتابە پیرۆزەکەی هانی داوین بۆ چاککرندنی نێوان موسڵمانان وە هانی داوین بۆ ئاشتەوایی یەك بوون ، وە نەهی کردووە لە پارچە بوون و جیاوازی

خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ①﴾ [الأنفال: ١].

واتە: ئەی محمد -صلى الله عليه وسلم- پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی دەسکەوتەکان، تۆ بڵێ: هەموو دەسکەوتەکان هی خواو پێغەمبەرن کەواتە لە خوا بترسن و **ئیصلاح** لە نێوانی خۆتان بکەن و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

وە خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَـٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ㉟﴾ [النساء: ٣٥].

واته : ئەگەر لەوە ترسان کە ناکۆکی و کێشەی نێوان ژن و پیاو گەورە بێتەوە ئەوا دوو کەسی عاقڵ و دیندارو دادپەروەر بنێرن یەکێك لە لایەنی پیاوەکەو یەکێك لەلایەنی ئافرەتەکەوە بۆ ئەوەی ئەوان صوڵح بکەن لە نێوان ئەو ژن و پیاوەدا ئەگەر ئەو دوو دادوەرە مەبەستیان صوڵح و ڕێکەوتن بێت و نیەتیان باش بێت ئەوە خوای گەورە نێوانی ئەو ژن و پیاوە ڕێك ئەخاتەوەو بەیەکتریان ئەگەیەنێتەوە  بە دڵنیاییی خوای گەورە زۆر زانایە وە زانیاریەکی زۆر ووردی هەیە .

وە بێگومان عبدالله کوری عباس رەزای خوای پەروەردگاری لەسەر ئەو ئایەتەی کردە بەڵگە لەسەر گەورەیی و پلەو پایەی صلحی نێوان موسڵمان لە ئیسلامدا لە کاتێکدا **گفتوگۆی** کرد لەگەڵ خەوارجەکان فەرموویی : هەرچی ئەو قسەیەتانە : (حوکمی خەڵکان لە فەرمانی خوای گەورە)

ئەوە من ئایەتێکتان بۆ دەخوێنمەوە لە کتابەکەی خوای پەروەردگار کە حوکم دەگەڕێنێتەوە بۆ خەڵك لە هەشت یەکی روبعە درهەمێك .

نەتان بینیوە وتەی خوای پەروەردگار : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ٩٥﴾ [المائدة: ٩٥].

واتە : ئەی باوەڕداران ئێوە ڕاو مەکەن لە کاتێکدا لە ئیحرام دان ئیحرام بە حەج یان بە عومرە وە ئەگەر کەسێك بە

عەمدی ڕاوی کرد ئەوە سزاکەی هاوشێوەی ئەو ڕاوەیە کە کردۆتی ئەبێ بیکات بەخێر ئەوە کەفارەکەیەتی لە وشترو مانگاو مەڕو بزن ، کە دوو پیاوی دادپەروەر لە موسڵمانان ئەوان بڕیار ئەدەن.

ئەوەنیە لە حوکمی خوای گەورە وابوو کە کەسانێکی هەڵبژاردوە حوکم بکەن ؟ ئەگەرویستی لێبوایە خۆی حوکمی دەکرد ، کەواتە ڕێگەیدا بە حوکمی خەڵکان ، سوێندتان دەدەم بە خوای پەروەردگار : ئایە حوکمی کەسێك لە چاککردنی نێوان کەسەکان لە نەڕێشتنی خوێن باشتر و گەورەترە یان کەرویێشکێك ؟ وتیان بەڵێ بەڵکو ئەوە گەورەتر و باشترە .

فەرمووی ( عبدالله کوری عباس رەزای خوای گەورەی لەسەر بێت) لەسەر ئافرەت و پیاوەکەی : ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ ﴿٣٥﴾﴾ [النساء: ٣٥].

واتە : ئەگەر لەوە ترسان کە ناکۆکی و کێشەی نێوان ژن و پیاو گەورە بێتەوە ئەوا دوو کەسی عاقڵ و دیندارو دادپەروەر بنێرن یەکێك لە لایەنی پیاوەکەو یەکێك لەلایەنی ئافرەتەکەوە بۆ ئەوەی ئەوان صوڵح بکەن لە نێوان ئەو ژن و پیاوەدا.

فەرمووی سوێندتان دەدەم بە خوا : ئایە حوکمی کەسێك لە چاککردنی نێوان ئەوانە وە نەڕێشتنی خوێن باشترە و

گەورەترە یان حوکمی دامێنی ئافرەت کە لەوە دەرچووە ؟ ووتیان بەڵێ.[1]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾﴾ [النساء: ١١٤].

واتە: خێر لە زۆرێك لە چپە چپ و نهێنی قسەكردنی خەڵكیدا نیە لەبەر ئەوەی زۆربەی لە تاواندایە تەنها مەگەر كەسانێ كە فەرمان بكەن بە صەدەقەو بەخێر كردن بۆ ئەوەی نەبێ بە ڕیا یان فەرمان بكەن بەچاكە یاخود چاكسازی و صوڵح بكەن لە نێوان خەڵكی وە هەر كەسێك ئەم شتانە بكات و نیەت و مەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت ئەوە ئێمە ئەجرو پاداشتێكی زۆر گەورەی ئەدەینەوە.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَالصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ الْأَنفُسُ الشُّحَّ ۚ وَإِن تُحْسِنُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾﴾ [النساء: ١٢٨].

واتە: وە ئەگەر ئافرەتێك ترسا لە گوێ پێ نەدان یا پشت هەڵكردنی مێردەكەی ئەوە هەردووكیان هیچ گوناهێكیان لەسەر نیە كە ئاشتەواییەكی چاك بكەن لە نێوان خۆیاندا هەر ئاشتەوایی و یەك كەوتن چاكترە هەر چەندە چروكی و ڕەزیلی تێكەڵاوی دەرونەكان كراوە، وە ئەگەر چاكە كارو

(١) رواه النسائي في الكبرى ( ٥/١٦٥ ) برقم (٨٥٢٢).

پارێزکار بن ئەوە دڵنیا بن بەڕاستی خوا هەمیشە بە ئاگایە لەوەی کە دەیکەن.

وە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ۝٩ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ۝١٠﴾ [الحجرات: ٩ - ١٠].

واتە: ئەگەر دوو دەستە یان دوو تاقم لەموسوڵمانان بوو بەشەڕیان ئەوەدەستبەجێ هەوڵ بدەن ڕێکیان بخەن و ئاشتیان بکەنەوە، خۆ ئەگەر لایەکیان هەر دەستدرێژی دەکردەسەر لاکەی تر، ئەوا ئێوە بەگژ ئەوەیاندا بچن کەستەم و دەستدرێژی دەکات هەتا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا جا گەر لایەنە سەرکەشەکە بۆ فەرمانی خوا سەری دانەواند ئەوا ئێوە ناوبژیوانێکی دادگەرانە لەنێوانیاندا بکەن و دادپەروەری ئەنجام بدەن، چونکەبەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کەدادپەروەری ئەنجام دەدەن (٩) تەنها باوەڕداران برای ڕاستەقینەی یەکترن ئێوەیش صوڵح و ئاشتەوایی بکەن لە نێوان براکانتاندا وە تەقوای خوای گەورە بکەن بەڵکو خوای گەورە رەحمتان پێ بکات (١٠) .

**پێشەوا ابن كثير** : ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت لە تەفسیری ئەو ئایەتە دەڵێت : "خوای پەروەردگار فەرمانی کردوە بەوەی صلح بکەین لە نێوان موسڵمانانێك کەیەکیان دەست درێژیان کردۆتە سەر ئەوەی تریان : ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ

﴿ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴾ ناوی لێنان ئیماندار لەگەڵ ئەنجام دانی کوشتاریش ، لەبەر ئەوە بخاری وە غەیری ئەویش ئەو ئایەتەیان کردە بەڵگە کە مرۆڤ لە ئیمان دەرناچێت بە تاوان ئەگەر چی گەورەش بێت ، نەك وەکو خوارج وە ئەوانەی شوێنیان کەوتون لە معتزلە غەیری ئەوان .

وە هەروەها ثابت بوە لە صحیحی بخاری لە فەرموودەی حسن لە ابی بکرە ڕەزای خوای گەورەی لەسەر بێت فەرمووی : پێغەمبەری خوا -ﷺ- رۆژێك وتاری دا ، لەسەر مینبەر حسن کوری علی لەگەڵ بوو ، جار جارە سەیری ئەوی دەکرد و وە سەیری خەڵکیشی دەکرد وە فەرمووی :

( إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ وَلَعَلَّ اللَّهَ تعالى أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ).

واتە: ئەوکوڕەم گەورەو بەڕێزە لەوانەیە خوای گەورە بیکاتە هۆی صلح لە نێوان دوو کۆمەڵی گەورە لە موسڵمانان ، هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا -ﷺ-، صلحی کرد لە نێوان ئەهلی شام و ئەهلی عێراق پاش جەنگێکی درێژ ، ڕوداوی گەورە .

وە فەرموودەی خوای گەورە : ﴿فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ﴾.

واته : تا دەگەڕێنەوە بۆ فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ، وە گوێ دەگرن بۆ حەق وە گوێڕایەڵی دەبن. هەروەکو چۆن ثابت بووە لە فەرمووودەی صحیح لە أنس ڕەزای خوای گەورەی لەسەر بێت : پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی : ( انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ،هَذَا نَصَرْتُهُ مَظْلُومًا، فَكَيْفَ أنصره ظالما؟ قال ﷺ : ( تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ فَذَاكَ نَصْرُكَ إِيَّاهُ )[٢].

واتە: براکەت بەسەر بێخە ئەگەر ستەم کار بوو یان ستەمی لێکرا بوو وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەم بەسەر خست کە ستەمی لێکرا بوو ، ئەی چۆن کەسی ستەم کار سەربخەم ؟ فەرمووی -ﷺ- ڕێگری لێ دەکەی دەستی دەگری لەوەی ستەم بکات ئا ئەوە سەرخستنە بۆی"[٣].

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ١٥٩﴾ [الأنعام: ١٥٩].

واتە: ئەو کەسانەی کە دینەکەیان بەش بەش و پارچە پارچە کردووە کە مەبەست جوولەکەو گاورو موشریکانە، وە مەبەست هەموو ئەهلی بیدەعە لە ئوممەتی ئیسلام کە بوونە بەچەند گروپ و حیزب و کۆمەڵێکەوە ئەی محمد -ﷺ- تۆ لەوان نیت و تۆ بەریت لەوان و لە کردەوەی ئەوان لە

(٢) رواه لإمام أحمد في مسنده (٣٤٩/٧) برقم (١٣٠٧٩).

(٣) تفسير القرآن العظيم (٣٤٩/٧).

تەفرەقەو پارچە پارچەیی کاری ئەوان تەنها ئەگەڕێتەوە بۆ لای خواو خوای گەورە خۆی سزایان ئەدات کە هەڕەشەیەکی سەختە پاشان لە ڕۆژی دوایی خوای گەورە هەواڵیان پێ ئەدا لەو کردەوانەی کە لە دونیا کردوویانە کە پێچەوانەی شەریعەتی خوای گەورە بووە.

**پێشەوا ابن كثير** -ڕەحمەتی خوای گەوەرەی لێبێت- لە تەفسیرەکەی بۆ ئەو ئایەتە دەڵێت :" ئاشکرایە ئەو ئایەتە عامە بۆ هەموو کەسێك کە پێچەوانە دینی خوای گەورە و خۆی جیابکاتەوە لێی ، چونکە بیگومان پەروەردگار پێغەمبەرەکەی -ﷺ- نارد بە هیدایەت و دینی حەق تا ئاشکرا و بەرزی بکات بەسەر هەموو دینەکان ، وە شەرعەکەی یەکە هیچ خیلافێکی تێدا نیە وە هیچ جیاوازیەکیش ، جا هەرکەسێك جیاوازی دروست بکات و بیکاتە گروپ ، واتە : گروپی وەکو ئەهلی پێش ئیسلام هەروەها لە هەواو ئارەزوو گومڕاکان ، ئەوە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی -ﷺ- بەری کردوە لەوەی کە لەسەرینە لە پارچە پارچەیی و تەفرەقە"[٤].

خوای گەورە دەفەرموویێت : ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ [الروم: ٣٠ - ٣٢].

---

(٤) تفسير القرآن العظيم (٣٣٩/٣).

واتە : ئەی محمد -ﷺ- تۆ ڕووی خۆت بە پاکی ڕابگرەو دامەزراو بە لەسەر دین و تەوحیدی خوای گەورە ئەم دینە پاکە ئەو فیترەتە پاکەیە کە خوای گەورە خەڵکی خستۆتە سەری، هیچ گۆڕانێك بەسەر دروستکراوی خوای گەورەدا نایات،ئا ئەمە دینی ڕێك و ڕاست و دامەزراوە بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن (٣٠) بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوە وە تەقوای خوای گەورە بکەن و خۆتان لە تاوان بپارێزن وە نوێژەکانتان ئەنجام بدەن بە ڕوکن و واجبات و خشوعەوە وە ئێوە وەك موشریکەکان مەبن (٣١)

لەوانەی کە دینەکەی خۆیان پارچە پارچە کردووەو وە بوونە بە کۆمەڵ کۆمەڵ و گروپ گروپ لە ئەهلی کتاب و ئەهلی بیدەع و ئەهلی ئەهواء هەموو حیزب و کۆمەڵێکیش دڵخۆشە بەو مەنهەجەی کە لەسەریەتی (٣٢).

**ابن کثیر** ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت دەڵێت :" ئەهلی دینەکان پێش ئێمە خیلاف کەوتە نێوانیان لەسەر بۆچون و نموونەی باتڵ ، وە هەموو گروپێك لەوان وا نیشانیان دەدا لەسەر حەقن ، وە ئەو ئومەتەش خیلاف و ناکۆکی کەوتە نێوانیان وەکو ئومەتانی پێشوو ، بەڵام هەمووی گومڕاییە تەنها یەکیان نەبێت ئەوانیش ئەهلی سونە و جماعەن ، ئەوانەی دەستیان گرتووە بە کتابی خوای پەروەردگار وە سونەتی پێغەمبەری خوا -ﷺ- ، هەروەکو چۆن سەرەتای ئەو

ئومەتە لە صحابە و تابعین پێشەوایانی موسڵمانان لە دێر زەمانەوە لە ئێستاش دا لەسەر بوون "[٥].

وە کاتێك فەسادی نێوان موسڵمانان بەهۆی بانگەوازکارانی تەفرەقە و اختلاف، وە سەرنەکەوتنیان وە پاشان زاڵ بوونی دوژمنان وە ئاشکرا بوونیان لەسەر موسڵمانان خوای پەروەردگار ئاگادارمان دەکاتەوە لە ناکۆکی، خوای گەورە دەفەرموویێت : ﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَـٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ۖ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ [الأنفال: ٤٦].

واتە : گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکەن -ﷺ- وە کێشە و ناکۆکی لە نێوانتاندا نەبێت، چونکە ئەبێتە هۆی فەشەل و دۆڕاندنتان وە هێزو قوەت و سەرکەوتنتان ئەڕوات و نامێنێت وە ئارام بگرن بەراستی خوای گەورە لەگەڵ ئارامگراندایە و پشتیوانیان ئەکات و سەریان ئەخات و یارمەتیان ئەدات.

وە هاتووە لە فەرموودەی صحیح لە ئەبی درداء دەڵێت: پێغەمبەری -ﷺ- فەرمووی: ( أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصَّلَاةِ

---

(٥) تفسير القرآن العظيم (٦/٢٨٥).

وَالصِّيَامِ وَالصَّدَقَةِ) قَالُوا: بَلَى. قَالَ: (إِصْلَاحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، وَفَسَادُ ذَاتِ الْبَيْنِ هِيَ الْحَالِقَةُ)[٦].

واته : پێتان ڕابگەیەنم ئەنجام دانی کارێك باشتر و گەورەترە لە پلەی نوێژ و ڕۆژی و خێر کردن ؟ -مەبەست پێی سونەتە- وتیان: بەڵێ. فەرمووی : چاککردنی نێوان موسڵمان ، وە خراپکردن وفەسادی لە نێوان موسڵمانان داتاشەرە.

وە زوبێری کوڕی عوام ڕەزای خوای گەورەی لێبێت دەڵێت : پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی: (دَبَّ إِلَيْكُمْ دَاءُ الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ: الْحَسَدُ وَالْبَغْضَاءُ , وَالْبَغْضَاءُ هِيَ الْحَالِقَةُ، لَا أَقُولُ تَحْلِقُ الشَّعْرَ وَلَكِنْ تَحْلِقُ الدِّينَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ -أَوْ وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ- لَا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَفَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِمَا يُثَبِّتُ ذَلِكَ لَكُمْ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ )[٧].

واتە : نەخۆشی ئومەتانی پێش خۆتان هاتە ناوتان : حەسودی وە ڕق و کین ، وە ڕق و کین داتاشەرە ، ناڵێم تاشینی پرچ ، بەڵکو تاشینی دین ، سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە - یان

(٦) رواه البخاري في الأدب المفرد برقم (٣٩١)، وأحمد في مسنده برقم (٢٧٥٠٨)، وأبو داود في سننه برقم (٤٩٢١)، والترمذي في جامعه برقم (٢٥٠٩). وصحح الحديث الألباني رحمه الله في [صحيح الأدب المفرد – باب إصلاح ذات البين (٣٩١/ ٣٠٢) ، وفي [صحيح الجامع الصغير وزيادته] (١/ ٥٠٦) برقم (٢٥٩٥).

(٧) رواه أحمد في مسنده برقم (١٤٣٠)، والترمذي في سننه برقم (٢٥١٠)، والبخاري في الأدب المفرد برقم (٢٦٠). قال الألباني رحمه الله في [صحيح الترغيب والترهيب] (٣/ ٤٤) حسن لغيره.

سوێند بەوەی نەفسی محمد – ﷺ - بەدەستە هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشت تا ئیمان نەهێنێت وە ئیمانیشتان تەواو نیە تا ئەوکاتەی یەکتریتان خۆش دەوێت ، ئایە پێتان ڕانەگەیەنم بە شتێك بۆتان جێگیر بکات ئەو خۆشەویستیە ئەوە سەلام کردن بڵاو بکەنەوە لە نێوان خۆتان .

بۆیە پێویستە لەسەر سەلەفیەکان هەموویان کە ئەو ئایەت و فەرموودانە لە پێش چاویان دابنێن ، وە واز لە خیلافات بهێنن کە لە نێوانیان دا هەیە ، لەبەر ئەوەی خیلاف شەڕە داوا لە خوای گەورە دەکەم هەموو لایەك تَوفیق بدات بۆ شوێن کەوتنی کتاب و سونەت ، دەست پێوە گرتنی.[٨]

**نوسینی** :

**ربیع بن هادی**

**شەوی یەکشەممە**

**٦/٨/١٤٣٩**

(٨) سەرچاوە : موقع الشيخ ربيع بن هادي المدخلي: http://rabee.net/ar/articles.php?cat=٨&id=٣٣٥